




منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

# چۆن کتێبێک بنووسم

خالد الراجحی

و. له عه‌ره‌بییه‌وه: بدوور ئه‌حمه‌د




# چۆن

# کتێبێک

# بنووسم

خالد الراجحی

و.لە عەرەبییەوە: بدوور ئەحمەد

پرۆژەی چاپی کتێبی مێخەک
زنجیرەی کتێب:٥٨
***
سەرپەرشتیاری گشتیی زنجیرە: سۆران خالد



کتێب: چۆن کتێبێک بنووسم
نووسەر: خالد الراجحی
وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: بدوور ئەحمەد
چاپ: یەکەم
تیراژ: ١٠٠٠دانە
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردنی( ١٤٨٦)ی پێ دراوە.
ساڵی چاپ:٢٠٢٠
چاپخانە: مێخەک
نرخ: ٢٠٠٠ دینار

مافی لەچاپدانەوەی ئەم کتێبە بۆ کتێبفرۆشی مێخەک پارێزراوە.

mexekbooks@gmail.com ٠٧٥٠٤١٤٥٢٥٠ facebook/ktebfroshymexak

## پێشەکی

خوێنەری هێزا ئەوەی لە بن دەستت دایە کتێبێکە لە قەبارەبچووک و لە ناوەڕۆکدا ڕەنگە سادەبێت، بەڵام بۆ ئەوانەی گەرەکیانە بنووسن یاخوود پێشتر نووسیویانەو دەیانەوێت باشتر بنووسن یارمەتیدەرێکی باشە.

ئەم کتێبە خنجیلانەیە ١٣ بەش لە خۆ دەگرێت، لە سەرەتای دروست بوونی بیرۆکەی نووسینەوە لات دەست پێدەکات تا دەگات بە چاپکردن و خستنە بازاری کتێبەکەتەوە. کۆمەڵێک ڕێگات نیشان دەدات، پێشتر خۆت پەیت پێنەبردوون، سادەن ئەمما زۆر پڕسوودن بۆ کەسێک کە بە دروستی جێبەجێیان بکات.

**چۆن کتێبێک بنووسم!؟** ئەگەر وەک ئەوەی نووسراوە هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵی بڕۆیت، بە دڵنیاییەوە ئەگەر بیرۆکەی نووسینت هەبووبێت لە دوای خوێندنەوەی ئەم کتێبە هیچ دوو دڵیت نا مێنێت و دەست دەکەیت بە نووسینی کتێبە دڵخوازەکەی ناو خۆت.

نووسین بە پرسارێتییە، تۆ کە قەرارت داوە بنووسیت هەوڵبدە بە شێوازێکی درووست و شارەزایانە بنووسیت. بەو هیوای ئەم دەرچەیکی باشبێت بۆ هەموو ئەوانەی وسیتی بوون بە نووسەریان هەیە.

شتێک بنووسە کە شایەنی خوێندنەوە بێت
یان کارێک بکە کە شایەنی نووسین بێت.

بنیامین فراکمین

# یەکەم:

## بۆچی دەنووسی؟





سەرەتا بە پرسیارێکی زۆر گرنگ دەست پێدەکەین، بۆچی کتێبێک دەنووسم؟، بەرژەوندیم چیە لە دەرچوونی ئەو کتێبە؟ هۆکار زۆرن بۆ نووسینی کتێب، بەڵام هەموو ئەو هۆکارانە ناخەمە ڕوو، بەڵکو دەوەستم بە هێنانەوەی یەک هۆکاری زۆر گرینگ بۆ نووسینەوە، کە وادەکات بابەتێکی زۆر گرینگ هەبێت بۆ نووسینەوەی کتێبێک، وەک چۆن لە فەرموودەیەک بۆمان ڕوونکراوەتەوە (عن ابي هريرة عن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال:-اذا مات ابن ادم انقطع عمله الا من ثلاث. صدقة جارية، او علم ينتفع به. او ولد صالح يدعو اليه )رواه مسلم

واتا کاتێک مرۆڤ «نەوەی ئادەم» کۆچی دوایی دەکات، تەواوی کردەوەکانی لەسەر دەپچڕێن جگە لە سێ شت:

چـــاکەیەکی نەبـــڕاوەی بەردەوام، زانســـتێک کە ســـوودی لێوەربگیرێـت«سـوود بەخـش بێـت بـۆ ئەوانـی تـر» یـان منـداڵێک«کـچ بێـت یـان کـوڕ» کە دوعـای بـۆ دەکـات.
لە کۆتایـدا نووسـینی کتێبێـک بەشـێکە لەو زانسـتەی کە سوودت لێ بینیوە، واتا مەبەست لەوە نیە تەنها زانست لە کتێبی ئاینیـدا، زانسـت لە پزیشـک سـوودی خـۆێ هەیە، و زانست لە ئەدەب و زانستەکانی تر....
پشـت بەخـوا زانسـتی بەسـوودن موسـولمانان وە ئەوانـی تـر سوودی لێببینن ئەمەش دەمانگێنێتە خاڵێکی گرینگ ئەویش بۆچی دەنووسین؟

کاتێک بڕیار دەدیت شتێک بنووسیتەوە وە سوودی هەبێت بۆ هەمـوو کەسـێک، پێویسـتە ئاگـاداری ئەوە بیـت کە شـتێکی بەسوود دەنووسی، نەک شتێک بنووسی کە زەرەر بە کۆمەڵگە بگەێنێـت، هەم لەڕووی بیرکـردنەوە هەم لە ڕووی زانسـتی، ئاگاداری ئەوە بە کە شتێک دەنووسی با سوودی بۆتۆ هەبێت و سـوودی بـۆ کـۆمەڵگە هەبێت، ئەمەش هۆکارێکی بەسـە بـۆ ئەوەی کتێبێک بنووسی،

هۆکـارێکی دیـکە هەیە کە ناکرێـت پشـت گـوێی بخەیـن و ئینکـاری لێـبکەین، ئەویـش بـریتییە لەوەی ئەو زانسـتەی کە هەتە وە دەیخەیتە سەر پەڕێک و دەینووسـیتەوە بـۆ سـاڵانێکی دورو تـا کۆتـای دەمێنێـتەوە، کە وادەکـات تەواوی مرۆڤـایەتی

سوودی لێ ببینن، چەندەها بیروکە و زانست و زانیاری لە ناوچوون لە نێو مێشکی گەورە زاناکان و فەیلەسوفەکان کە پێیان وابوو ئەوەی هەیانە و ئەوەی دەیزانن شایەنی ئەوە نییە بنووسرێتەوە.



## دووباره پرسیارێکی گرینگ: چی دەنووسی؟

بۆ ئەوەی بابەتەکە ئاسانتر و پوختتر بکەین، ڕەنگە پێت بوتری چیرۆکەکەت بنووسەوە، جا چیرۆکەکەت هەر چیەک بێت، یا هەر زانیاریەک کە هەتە ڕەنگە بەشێوازێکی حەزلێکراو چیرۆکەکە بنووسی: لە کۆتایدا وادەکات ئەوەی بە بیرت بێتەوە ئاسانە، لەبیرمە، لەکاتی هەوڵدانم بۆ ئەوەی کۆتایی بە نووسینی نامەی دکتۆرا بێنم، دوای تۆێژینەوە و خۆیندنەوە لە ماوەی چوار ساڵ، زانیاریەکان هێندە زۆربوون نەمدەتوانی لە ناو نامەی دکتۆرا کۆیان بکەمەوە، بۆیە لەسەرپەرشتیاری خۆمم پرسی؟ چۆن بتوانم ئەو هەموو زانیاریانە کۆبکەمەوە بە شێوازێکی باش دایبرێژمەوە!؟

سەرپەرشتیارەکەم ئامۆژگاریەکی زۆر جوان و ئاسانی کردم سوودێکی زۆر زۆر باشم لێبینی پێ وتم:—

ئامۆژگاریت دەکەم کاتێک دەنووسی وابزانە چیرۆکێک دەنووسی، کەسێک بهێنە پێش خۆت، وا باشترە کەسێکی ئاسایی بێت، دواتر بۆی باسبکە کە چیت کرد کاتێک تۆیژینەوەت نووسی، وە چۆن ئەو تۆیژینەوەیەت نووسی، بەڵام بە شێوازێک بۆی باسبکە کە قابیلی تێگەیشتن بێت، ئەو ڕێگایە بوو کە گرتمە بەر لە کاتی نامەی دکتورام، وە هەمان ڕێگا بوو کە لە یەکەم ئەزموونی نووسینی کتێب پەیرەوم کرد (جسر من ضوء___پردێک لە ڕووناکی ) کە تیایدا هەستام بە بیرهێنانەوەی چیرۆکەکەم بە ڕێگایەکی زنجیرەیی ئاسان، کەسی بەرامبەر کاتێک گوێی لێرادەگرێ هەست بە نەرم ونیانی وگونجانی و جوانی دەکات.

خاڵێکی دیکە هەیە لەسەر بابەتی چی بنووسین، کەواتە لەبەر ئەوەی باسی ئەزموونی کتێبی پردێک لە ڕووناکی دەکەم (جسر من ضوء)، چەند کەس بە نێردراوی گەشتی کرد؟ ژمارەیەکی زۆر زۆر، باشە چەند کەس ئەزموونیان بەدەست هێنا، هەموویان! بەلێ هەموویان، ئەزموونیان بەدەست هێنا، زۆر ئەستەمە نێردراو کرابێت و بخوێنی ساڵێک دووساڵ چوارساڵ، هیچ ڕوداویکی غەریب و جیاوازت لەسەر تێنەپەری بێت، بەڵام چەند کەس وەک ئەم ئەزموونانەیان نووسی؟ بۆیە هەموو کەس دەچێت وە هەمان هەڵە وئەزموون دووبارە

دەکاتەوە، بەڵام ئەگەر ئێمە ئەو ئەزموونانە بنووسین چی روو دەدات؟
دەبینین هەر کەسێک کە نیەتی گەشتی هەیە کتێبێک دوو کتێب دەخوێنێتەوە کە هاوشیوەی ئەو ئەزموونانەیە وکار ئاسانی بۆ دەکرێت تا بگات بە ئامانجەکانی، لە جیاتی ئەوەی هەمان هەڵە دووبارە بکرێتەوە یا لە هەڵەی کەسانی تر فێربین، نە من نە تۆ نە هەمووان
نە حیکمەتی تێدایە نە لۆژیکە، باجی هەمان هەڵە بدەینەوە لە یەکجار زیاتر.

هەڵە و ئەزموونەکانت بنووسەوە، هەڵەو و ئەزموونەکانم دەنووسمەوە. تا ئەوانەی لە دواماندا دێن لەو شوێنە دەست پێبکەن کە لەوێ کۆتایمان پێ هینا، ئەزموونەکانت بە شێوازێکی زنجیرەی ڕوون بنووسەوە، تاکو ئەوەی بیەوێت سوودی لێ ببینێت، ڕەنگە کەسێک بڵێت لەو روداوانەی کە تیایدا تێپەرێم هیچ ئەزموون و پەندم بەدەست نەهینا، ئەمە هەڵەیە و ڕاست نیە، هەموو گفتوگۆیەک لە ژیان چیرۆکێکە، هەر روداوێکیش لە ژیانت ڕووبدات ڕەنگە ببێتە ڕۆمان،
لەسەر گەشتەکەت چێرۆکێک بنووسە بڵێ (گەشتم کرد، رۆیشتم، فێربووم، خوێندم وە هەموو شتێک لە پێشم بە سەرکەوتووی ئەنجام درا، و توشی هیچ گرفتێک نەبووم، وە هەروەها ئەزموونی زۆرم بینی..هتد.

سەیرکە ئەوە چیرۆکم بۆ خوێندنەوە، لەبیرت بێت نەبوونی چیرۆکێک خۆی لە خۆیدا چیرۆکێکە.
بەو شـــێوازە ئامـــاژە بەیەکێـــک لە کتێبـــی ســـتونەکانی رۆژنامەنووسەکان دەکەم،
کتێبی وتاردان لە یەکێک لە رۆژنامەکان دەڵێ:
هەندێک جار وەک کتێب، هیچ نیە باسی بکەم، چی بکەم؟ دەست بەوە دەکات ئازارەکانی یا خەمەکانی باس دەکات کە هیچ بابەتێک نیە باسی بکات ئەم وتارە باسی ئەو لایەنەی کرد، ئەم بابەتە بە تایبەتی لە باشترین نووسینەکانی ئەو رۆژە بوو لە ناو رۆژنامەکە.

پوختە:-

هەمیشە چیرۆکێک _ زانیاریەک _روداوێک هەیە
بەڵام پێویســتی بە گەشــەپێدانە بــۆ زانینــی چیــرۆکەکە، وە پێویســتی بە هەڵێنجــدان و شــیکردنەوەی روداوەکەیە، تــاکو سوودی لێ ببیندرێ، هەروەها شتێکی تر هەیە کە گرینگە، کاتێک شتێک دەنووسی تۆ یەکەم کەسیت کە سوودی لێ ئەبینی، چونکە فێری زۆر شت دەبیت، و پێداچونەوە بۆ ئەو بابەت و زانیاریانە دەکەی کە لە یادت کردبوون،
هەنـدێک لەو شتانەی کە لە کتێبی ( پردێک لە ڕوونـاکی ) نووســیومە لە یــادم کردبــوو و دوای هەوڵــدانم بەبیــر خــۆم بێنمەوە، بـۆم بە دیـار کەوت وەک ئەو ئەزمـوونەو زانیاریـانە بوو، جا نووسین شتێکی گرینگە مەرج نیە نووسەر بیت، ڕەنگە

لەسەر شێوازی وتار بێت، یان یادگاری بێت یان تویت بێت لە تویتەر بڵاو بکرێتەوە وەک نموونە.



بیـرۆکه دەبێـت نـاوازە بێـت: تـاکو شـتێک هەبێـت بگـوتری و باس بکرێت، نابێت شتێک بنووسیت تەنها بۆ ئەوەی بڵێن شـتێکی نووسـیوە، چیـرۆک دەبێـت بە وردەکاریەکـانیەوە بە سوودەکانیەوە بە نایابەکانیەوە باس بکرێت،

ئەگەر ڕێـک بکەویـن کە بیرۆکەیەکـت هەیە، بیـرت بێـت نەبوونی بیـرۆکە خـۆی لە خۆیـدا بیـرۆکەیە، ڕۆڵـی گێـڕانەوەی چیـرۆک دەسـت پێـدەکات، دەتـوانم بە شـێوازێکی بێـزارکەر چیـرۆکەکەت بـۆ بگێـڕمەوە، بەبێ حەمـاس بەبێ چێـژ یـاخود دەتوانم بە شێوازیکی نایاب و ڕێک بۆت بگێرمەوە پڕ حەماس و چێـژ بەخـش بیـت، بـۆ نمـوونە:- ئەمـڕۆ درەنـگ لە خەو خەبەرم بـووە وە درەنگـیش گەیشـتم بـۆ دەوام! چیـرۆکەکەم کۆتای پێهات نە چێژ بەخش بو نە پڕ حەماس بو زۆریش

بێزارکەر بو وهیچ شتێکی نوی تیدا نەبو، بەڵام دەکرێت، بە شێوازێکی تر بگیرمەوە بۆ نموونە:
ئەمڕۆ درەنگ لە خەو هەلسام هۆکاری درەنگ هەلسانیشم دۆینی تا درەنگانی شەو بەخبەر بوم
ئەمەش زەرەر بە تەندروستیمان دەگەێنێت، دەبوایە کاتەکانم باشتر ڕێک خستبایە، توێژینەوەکیش ئەمەی دوپات کردۆتەوە هۆکاری درەنگ چونە دەوام درەنگ خەوتنە...هتد
پێویستە پوختیەک دەربێنی لە بیروکە و پەند تا بزانی چی بە کەسی بەرامبەر دەگەیێنی
توانای تێبینی کردن و هەلێنجان کارێکی گرینگە وە پێویستە پەرە بەو بابەتە بدەی چونکە پێویستی بە ڕاهێنانی زیاترە،
زۆر لە کەسەکان هەن بە رودای زۆر تێدەپەرن بەڵام نازانن چۆن باسی بکەن و شیبکەنەوە، هەندێکیتر دەتوانن تێبینی زۆر بکەن و شتەکان شیبکەنەوە لەسەر ئەو روداوانەی تێیدا تێدەپەرن،
وە پێویستە لەسەرت بۆ پەرە پێدانی سەرکێشی لەم جۆرە بابەتانە ڕاهێنان بکەی، لەگەڵ شێوازی گێرانەوە، وە هیچ شتێک لە خوێندنەوە گرینگتر نیە بۆ ئەوەی پەرە بەو بابەتە بدەی،

ڕەنگە کڕینی کتێبێک کارێکی باشبێت،
ئەگەر بکرێت لەگەڵیدا،
کاتی خوێندنەوەی بۆ بکڕیت.

ئەرتۆر شۆپنهاوەر



دوای ئەوەی کە بوینە خاوەن بیرۆکە، چۆن بتوانین دەست بە نووسینەوەی بکەین و بکریتە کتیبێک، واباشترە سەرەتا بە فەهرەست دەست پێبکەین دواتر دەست بکەین بە نووسینەوەی چیرۆکەکە لە ڕێگای بەشکردنی، لە ئەزموونی کتێبی پردێک لە ڕووناکی کتێبەکەمان بۆ پێنج بەش دابەش کرد و نووسینی ناونیشانەکان بە تەنها، هەموو ئەو ناونیشانانەی هاتنە بیرم نووسیومن، دواتر دەستم کرد بە نووسی ڕوداوەکان بە شێوازێکی زنجیرەیی تەنها وەک ناونیشان، بێ ئەوەی دەقەکانی نێو کتێبێکە بنووسم، دواتر دووبارە دارشتنم بۆ ناونیشانەکان کردەوە لە ڕێگای ڕێکخستنی ڕوداوەکان لەو کاتەی کە رویان داوە تا دواتر کە بەیەک بەسترانەوەو بونە زنجیرەیەک لە بیرۆکە، تەواوی بەشەکانی کتێبەکە بە هەمان شێوە بوو، دواتر هەستام بە پەرەپێدانی ناونیشانەکان و ڕێکخستنیان بە شێویەکی جوانتر و رازاوەتر،

ئەم هەنگاوە پێویستی بە کاتێکی زۆرە، بۆ ئەوەی پێبگات و گەشەی بکات. واز لەو بەشە بێنە با پێبگات دەست بە بەشێکی تر بکە و کاری لەسەر بکە، کتێبی پردێک لە ڕووناکی بۆ ماوەی مانگێک وازم لێی هێنا و دەستکاریم نەکرد، تا بیرۆکەکان بە تەواوەتی پێگەین (تخمیر)

لە ماوەی پێگەیشتن بۆت دەردەکەوێت زۆر شت هەیە لەگەڵ ئەم کتێبە ناگونجی، یاخود زۆر ڕوداو و بارودۆخی گرینگت بیرچووە بیان نووسیت، کتێب خۆی لە ڕاستیدا وەک ئامادەکردنی چێشتە پەلە مەکە لە سووتاندنی بە ئاگر، لە هەمان کاتدا لێمەگەڕێ ساردبێتەوە، بیرۆکەکانیش پێویستیان بە گرینگی پێدانە تا نەمرن، و یەکسان بە لە نێوان هەردووک بابەتدا.

من مرۆڤێکی زۆر ئاسایم،
من تەنها حەزم بە خوێندنەوەی کتێبە

هاروکی مۆراکامی



ئەم خاڵە تەوەرێکی گرینگە بۆ نووسینەوەی کتێب، بۆیە دەبێت گرنگی زۆر وردی پێبدەی، نابێت تێیپەڕێنیت تا تەواو پێنەگات، ئەگەر بینایەکەت بە جوانی و سەرنج ڕاکێشی بنیات نا، بە ڕێک و پێیکەوە دروستت کرد، ئەوە دەبیتە خاوەن کتێبێکی سەرکەوتوو، بەڵام ئەگەر بە ڕێکوپێکی دروستت نەکرد و ڕیزبەندی و بیرۆکەکان لەگەڵ یەک نەگونجا و پچر پچر بوون و پەیوەندیان بە یەک نەبێت، ئەوە هەموو شتێک لە دەست دەدەیت.

بۆیە پێنجەم دووبارەی چوارەم بوو بە هەوڵ و ماندوبوونێکی زیاتر بە راوێژکردن و کاتێکی زیاتر، تا هەست بە هێز و چەقینی بیرۆکەکان بکەیت لە شوێنی خۆیان وە هەست بە چێژ و شۆخی بکەیت لەوەی چی دەنووسیت.

دوای نووسینی ناوەڕۆکەکان بەردەوام با نووسینەکانت لەگەڵ بێت لە گەشت یاخود لە کەش و هەوایکی دیاری کراو، دووبارە لە سەرەتاوە بیانووسەوە، لە ئەزموونی نووسینی کتێبی

پردێک لە ڕووناکی، دوای پێداچونەوەم بۆ کۆمەڵێک ناونیشان بە خـۆمم وت، ئەستەمە تـۆبڵێی مـن ئەم جـۆرە ناونیشـانەم دانابێت کە هیچ بە هایەکی نیە بەڵکو ناونیشانی گرینگتر هەن کە هێشتا نەنووسراون،

بـۆت دەردەکەوێـت ئەم کـاتەی بـۆ چیـرۆکەکەت تەرخـان کردوە بە تەواوی پێگەیشتووە، پەرە بە ناونیشانەکەت بـدە کە سەرنج ڕاکێشیان پێوە دیار نیە، بێگومان دەرک بەوە دەکەیت لە سـەرەتاوە کۆمەڵێـک ناونیشـانی نایـاب و جیـاواز هەبـوون، دوای دووبارە نووسینەوەیان و چـاک کردنیان باشـترو جـوانتر سەرنج ڕاکێشتر و بریقەدارتر دەبێت.

## تێبینیەکی جەوهەری/

نووسەر هەرگیز نابێت تەواو تەواو ڕای لە نووسینەکەی خـۆی بێـت، بەڵکـو دەبێـت هەسـت بە شـک و گومـان و قەنـاعەت نەبـوون بکـا، تـاکو ئاسـتی نووسـینەکەی بەرزتـر بکـاتەوە، بـۆیە ڕەخـنەی خـود ڕەخـنەی نەفسـی خـۆت بـکە بە هاورێـت، مەوەســتە لە ڕەخنەگــرتن لە کتێــبەکەت تــاکو دەگــاتە چـاپکردنیش، تەنـانەت ئەگەر لە دوایـن سـاتەکان بویـت لە چـاپکردن وە پێویسـتی بە هەمـوارکردنەوە بـو ئەوە چـاکی بکەیت بێ دوودلی ڕیبگرەو چاکی بکە.

ئەمە رەوالەتی قسەی مرۆڤە بیگومان ناگەتە ئاستی بێخەوشی، گومانی تێدا نیە کەموکورتی تێدادەبێت.

خوێندنەوە دەریدەخات کە چۆن ببیتە کەسێکی باشتر.

دۆناڵد ترامپ



دوای ئەوەی ناونیشـانەکان و ناوەڕۆکەکـان ئامـادە بـوون لە دوای پیـداچونەوە و چـاکردن و گونجانـدنی لەگەڵ یەک، دەست بکە بە بەشی یەکەمی کتێبەکەت، دەست بە نووسینی ناونیشـانی یەکەم بـکە، لە قۆنـاغی یەکەمـت بەبێ ڕاوەسـتان بەردەوام بە لە نووسـین، وەک چـۆن بڵێـی بـارانێکی بە لێـزمە دەبـارێ لەسـەر پەرەکـان بەبـێ ڕاوەسـتان، هەڵنەسـتی بە پیـداچونەوە لەسـەر هەڵەی ئیملائیـت وە پێـداچونەی لە روی زمـانەوانی، تەنهـا بنووسـە و مێشـکت بەتـاڵ بـکەوە.....بنووسـە بنووسە دوای ئەوەی کە ناونیشانی بەشی یەکەمت تەواو تەواو کـرد لـێگەڕی و بـرۆ سـەر بەشـەکەی تـر، تـا تەواو دەبیـت لە هەموو بەشەکانی تر، دواتر بـۆت دەردەکەوێـت هەمـوو ئەوەی هەبوو خستە سەر پەڕە و هیچی تر نەماوە زیادی بکەیت،

## بەڵام دواتر چی ئەکەیت؟

ئەوەی نووسیوتە بۆ مانگێک دوو مانگ جێیبهێڵە، نووسینی کتێب پێویستی بە ئارمگرتنێکی زۆرە، لە ئەزمـوونی کتێبی پردیک لە ڕووناکی بۆ ماوەی دوو ساڵی پێچوو لێمگەرا، هەروەها بۆ ئەوەی کارکردن لەسەر کتێبەکەت مەعقول و شیاو بێت ئەوە تۆ پێویستیت بە ئارامیە، ڕەنگە گونجاوبێ پشت بە شێوازی پاداشت ببەستێ مەرج نیە ئەو پادشتە زۆر گەورە بێت، ئەم شێوازە بۆ پاڵنەری خودە بۆ هەر قۆناغێک کەنووسینەکەت تەواو ئەکەی.

دوای تێپەربوونی دوو ساڵ دەگەڕێتەوە سەر کتێبەکەت، بۆت دەردەکەوێت شتی جوان و پەرۆش هەنە کە لە یادت کردوە باسیان بکەیت، پێویستە بەردەوام ئەو شتانە بنووسی کە لە یادت کردون، نووسینی ڕوداوەکان و بیرۆکە نوێیەکان، یادگاریەکان، هەمان پرۆسە دووبارە بکەوە، برۆ شوێنی دوور لە جەنجاڵی، دوور لەو شوێنانەی کە دڵگرانت دەکەن، شوێنێک زنجیرەی بیرۆکەکان نەپچرێنێ. تا هۆش و تەرکیزێکی باشت هەبێت، زیاتر تیشک بخەیتە سەر نووسینەکانت.

من مرۆڤێکی زۆر ئاسایم،
تەنها حەزم بە خوێندنەوەی کتێبە.

هاروکی مۆراکامی



قۆناغی نووسینی کۆتای واباشتره ناوی لێبنێن قۆناغی (بەرزکردنەوەی ئاستی نۆسراوەکان )
لەم قۆناغدا تێبینیەکان کەمترن، بۆت دەردەکەوێت کە دەربڕینی زۆر جوانت نووسیوە وە هەستی پێ دەکەیت، لەبەرامبەر ئەمەش هەندێک دەربڕین هەن کە ناگونجێ و کاتی هاتووە چاکیان بکەیتەوە، ئەوەی لەم قۆناغەشدا گرینگە کە دەیخوێنیەوە هەست بە ڕەخنەگرتنی کۆتای بکەیت، بە دوای هەڵەکان دەگەڕێیت هەر چۆنێک بێت، ئەمەش کۆتا کۆپیە کە قابیلی ڕاستکردنەوە و چاکردنەوەیە، کتێبەکەت ئامادە دەبێت، دوای تێپەر بونت بەم خالانە:-

١-ئامادەکردنی ناونیشانە بنەڕەتییەکان.
٢- جی هێشتنی ناونیشانەکان بۆ ماوەیەک تا پێدەگات.

٣- بەدواچــونەوە و گونجانــدنی ناونیشــانەکان دوای ئەوەی ماوەیەک لێیگەڕاویت.

٤- نووسینی بابەتەکان لە ژێر ناونیشانەکان.

٥- جێ هێشتنی نووسینەکان بۆ ماوەیەک تا پێدەگات.

٦-نووسینی کۆتای و دۆزینەوەی هەڵەکان.

تەنها بە فێربونی خوێندنەوە تا ئەبەد ئازاد دەبیت.

فریدریک دوگلاس

هەشتەم:

# ڕەخنە و ڕاوێژکردن





ئەوەی پەیوەندی بە ڕەخنەگرتنی کتێبەوە هەیە، ڕەخنەگرێکی کتێب بانگ بکە، بەرای خۆم واباشترە لەسێ ڕەخنەگر زیاتر نەبیت، متمانەی ئەو کەسە وەرگرە و هەلێبژێرە کە شارەزاو چاکە لەگەڵت، ئەوەی لە هەمووی گرینگترە ڕێگە نەدەی کەسانی تر بەژداربن لەگەڵت وە ئەو هەستەیان پێنەبەخشی کە بەژدارن بۆ نووسینی کتێبەکە، وا مامەڵەیان لەگەڵ بکە کە تەنها تێستی دەکەن و ڕای خۆیان دەڵێن، بێ ئەوەی زیادی بکەن یان هەمواری بکەنەوە یاخود کەمی بکەن، هەڵسە بە کۆکردنەوەی تەواوی هەموارکردنەوەکان کە وتویانە، نووسەر وەک چێشتلێنەر وایە ڕاوێژ دەکات بۆ تێستی خواردنەکە بێ ئەوەی ڕێگە بدات لەگەڵی دروست بکەن، هەر چێشتێک چێشلێنەری زۆر دەستی تێوەردەن تێکدەچێ، وەک پەندێکی کوردی، چێشتی بەزۆر کابانن یان پر خوێیە یان بێ خوێیە.

هەروەها پێویستت بە ڕاستکەرەوەی زمانەوانیە کە هەڵدەستێ بە پێداچونەوەی کتێبەکەت ئەگەر تۆ کەسێک بیت شارەزای زمانی کوردی نەبیت، تەنانەت ئەگەر شارەزای زمانی کوردیش بیت ئەوە بێگومان هەر پێویستت بە ڕاستکەرەوەی زمانەوانیە، و ڕاستکردنەوەی هەڵەی ئیملائی، چونکە هەڵەی ئیملائی لە هەمووی باوترە زۆر ڕودەدا، ئەم خزمەتەش لە دەزگاکان کە هەڵدەستن بە دیزاین و تەنسیق کردنی کتێب هەیە.

گرینگە زۆر بە جددی مامەڵە لەگەڵ هەر ڕەخنەیەک بکەیت، ڕەخنەگرتن بەخشینێکە پێویستە لەدەست خۆتی نەدەی، بۆ ئەوەی ئاستی کتێبەکەت بەرز بکەیتەوە، بەڵام ڕێگە نەدەی ڕەخنەگرتن لەسەر ڕێگاکەت لاتبدات، هەمووارکردنەوەی ڕێگاکە کارێکی ئاساییە دەکرێت، بەڵام تەواو گۆرینی وادەکات شتێک بنووسی دوربێت لە کتێبەکەت.

ئەگەر بمتوانیبا بە بەردەوامی بخوێنم،
ئەوە هەرگیز پێویستیم بە هاوڕێیەتی کەس نەدەبوو.

جۆرج گۆردۆن بایڕۆن

## نۆیەم:

# ناونیشانی کتێب





ناونیشـانی کتێـب ئەو پەیـامەیە کە لە نـاوڕۆک دایە هەروەهـا ناونیشانی خۆتە، ناونیشانی کتێب زۆر هەستیارە. پێویستە دڵنیا ببیتەوە ناونیشانی کتێبەکەت ڕەنگدانەوەی تەواوی کتێبەکەتە، بیگۆمـان پێویسـتی بە کـاتێکی زۆر هەیە بـۆ هەڵبژاردنـی، هەندێک ناونیشان لەسەرەتای نووسینی کتێبەکە دەنووسرێ و دیـاری دەکرێـت، بەڵام کاتێـک کتێـبەکەت تەواو دەکەی دەبینی ناونیشانەکە شتێکی ترە، لە ئەزموونی کتێبی پردێک لە ڕوونـاکی، سـەرەتا بە ناونیشـانی (قەلاسـقو) بـوو، سـەرەتا ئەو ناونیشـانەم هەڵبـژارد، دوای ئەوەی کتێـبەکەم ئامـادە بـوو بـۆ نـزیکەی دوو مانـگ بیـرم لە ناونیشـانی کتێـبەکەم کـردەوە، یەکێـک لە هاورێیەکـانم ئامۆژگـاری کـردم ماموسـتا (صـاڵح فەوزان) کە کات بدەمە خۆم بۆ ناونیشانی کتێبەکەم و پەلەی لـێ نەکەم، بەڕاسـتی زۆر بیـرم لەناونیشـانەکەم دەکـردەوە، تـا کۆمەڵێک ناونیشانم دیاری کرد، زۆریـان لە ڕێگای پێشنیاری

بینەرەکانم بوو لە تۆری کۆمەڵایەتی تویتەر. دواتر لەگەڵ ئەندامانی تیمی بڵاوکردنەوە کۆبومەوە، کە کاریان لەسەر کتێبەکە دەکرد و پێداچونەوەیان دەکرد ئایە ڕەنگدانەوەی ناوەڕۆکە یاخود نا، بەم جۆرە ناونیشانەمان هەڵبژارد، بەڵام کاتێکی زۆری خەیاند بۆ هەڵبژاردنی تۆش پەلە مەکە.

پیوسته بخوێنیته‌وه کتێبێک دوو کتێب نا،
ڕۆژێک، هه‌فته‌یێک. مانگێک ساڵێک نا،
به‌ڵکو پێویسته ببێته کاری ڕۆژانه له ژیانت،
بێ ئه‌وه‌ی ڕۆژیکت له‌سه‌ر تێبپه‌ڕێ به‌بێ
خوێندنه‌وه.

راغب سه‌رجانی



پێویستە یەکسانی بکرێت لە نێوان تیچووی و سەرنجراکێشی کتێبەکەت، ناکرێت تیچووەکەی زۆربێت و رێگە نادرێت دیزانەکەی کەم بێت و ئاڵۆز و پەرتوبلاو بێت، پێویستە دیزاینی کتێب و بەرگەکەی و ناوی وەک یەک بێت ئەمە کارێکی ئاسان نیە، ناکرێت تەواو تەواو بۆ دیزاینەری کتێب جێبێڵین تەنانەت ئەگەر پرۆفیشنال بوو، تۆ خاوەنی کتێبەکەتی، بەڵام دیزاینەرێکی تایبەت نیت، پشت بە دیزاینەرێک ببەستە رۆحی کتێبەکەت بۆی باس بکە بۆی بنیرە، تاکو دیزاینێکی جوان وگونجاو دەربچێت، لەگەڵ بابەت و ناوەرۆکی کتێبەکەت بگونجێ وەک چۆن خەونت پێوە ئەدیت.

## یازدەم:

# بەخشانگە _ بڵاوکار





دیاریکردنی بڵاوکار بۆ بڵاوکردنەوە کتێبەکەت خۆی لە خۆیدا کێشـەیە، بـابەتی ئەوەی کەسـێک بـدۆزیەوە کتێـبەکەت بـۆ بڵاوبکاتەوە بابەتێکە بە ئاسانی بە دەست نایە، بەڵام پێویستە بڵاوکارێـک بـدۆزیەوە کە لەگەڵ کتێـبەکەت و بیـرۆکەکەت بگـونجێ، ئەگەر کتێبەکەت ژیـانی یـاوەرانی پێغەمـبەر درودی خوای لەسەر بێت باس بکا مـاقوڵ نـیە کتێبەکەت ببەی بۆ بڵاوکارێک کە گرینگی بە کتێبی منداڵ دەدات، ئینجـا لە کـاتی ئەوەی جۆرەهـا کتێبەکـان لە لایەن بڵاوکـار دەبینـی دەتـوانی ئەوەش بزانـی تـا چەنـد کتێـبەکەت لەگەڵ ئەو بڵاوکـارە دەگونجێ، ئەو بڵاوکارە هەڵبژێـرە کە گرینگـی بە کتێـبەکەت ئەدات، لەمـاوەی ئەزمـوونی خـۆم بـۆم دەرکەوت، زۆرێـک لە بڵاوکارەکـان گرینگـی نـادەن بە کتێبەکـان و باسـی نـاکەن، و هەنــدێکیش هەن تەنهــا گرینگــی بە کتێبــی نووســەرە بەناوبانگەکان دەدەن، ڕێگە مەدە لایەنی ماددی ببێتە کێشەی ســەرەکیت بە تــایبەت لە کتێبــی یەکەم، ئەوەی بــۆت دەگەڕێــتەوە ســەرکەوتنی کتێــبەکەتە،کە بەم جـۆرە دەبێـتە هێنانەدی ئاواتەکانی تر.



بازارکردنی کتێب گرینگترین کارە، ئەشکرێ ئامرازی تۆرە کۆمەلایەتیەکان بەکاربێنین، وە لە ئەزموونی کتێبی پردێک لە ڕووناکی کاری بە بازارکردنیم کردە دوو بەش:

١.-بە بازارکردن پێش بڵاوکردنەوە
٢.-بە بازارکردن دوای بڵاوکردنەوە

## ١ –بە بازارکردن پێش بڵاوکردنەوە:

دەستمکرد بە بڵاوکردنەوەی کۆمەڵێک ناونیشان لە تۆری تویتەر، کە دەستمکرد بە پۆست کردنی ناونیشانی کتێبەکەم بە ناونیشانی کتێبێکی نوێ، کۆمێنتەکان دەربارەی ناونیشانی کتێبەکە بۆم دەهاتک، پرسیار دەرەبارەی کاتی بڵاوکردنەوەی کتێبەکەم لێدەکرا، وەڵامم ئەداوە بۆ ئامادەکردنی پێشوەختە، تاکو لە کۆی ٥٢ ناونیشان ٦ ناونیشان بووە باوترین لە ماوەی پچراو پچراو، بەم کارەش گرینگی و ئەکتیفی هەوادەرەکانم بەدی کرا لەگەڵ کتێبەکەم، لە ڕێگای هەوادەرەکانم ناونیشانی کتێبەکەم هەڵبژێردرا کە کۆێ گشتیان ١٠,٠٠٠ داوام لێکردن پێشنیاری ناونیشانەکم بۆ بکەن دوای ئەوەی فکرەیەکی تەواوم پێدان لەسەر کتێبەکە، ئەم فکرەیە وەک ئەوە وابوو دوو چۆلەکە بە یەک بەرد بکوژی، چونکە هەم گوێیان لێ ڕادەگرم لە هەمان کاتدا کتێبەکەش دەخەمە بازار، هەروەها ڕامگەیاند کۆپیەک لە کتێبەکەم کە واژوی خۆم لەسەرە دەکەمە دیاری بۆ ئەو کەسەی کە ناونیشانێکی جوان و گونجاوم بۆ هەڵبژێری، بەم جۆرە کتێبەکەم بە هێز بوو، زۆر ناونیشانم پێدەگەیشت بەڵام هیچیان لەگەڵ کتێبەکەم نەدەگونجا تەنها ئاوی مەنگم پێ جولاند، وە سوودم لە زۆر بیرۆکە وەرگرت، بەم جۆرە کتێبەکەم خستە بازاڕ، بەم ڕێگایەدا زۆرێک ئاشنابوون بە کتێبەکەم،

## ٢ _بە بازارکردن دوای بڵاوکردنەوەی کتێب:

دوای بڵاوکــردنەوەی کتێــب و دەرچــوونی لە چــاپەمەنی جــوانترین ســاتەکانە بــۆ نووســەر، تــا بڵاوبکــرێتەوە و بخوێندرێتەوە، ئەم هەستە هاوشێوەی ئەو هەستەیە کە خودا منداڵێکت پێدەبەخشێت، لەم کاتەدا دەبێت زیاتر کار لەسەر کتێبەکەت بکەیت لە کاتەکانی تر، هەموو ئەوانەی کە کردت جددی نەبووە، ئەم وتەیە دەربکە لە بیرۆکەت کە دەڵێت (لێگەرێ کتێبەکەت خۆی بە بازار بخرێ و خۆی بفرۆشێ)

ئەم قسەیە ڕاست نیە ئەگەر بەناوبانگ نەبیت، تەنانەت ئەگەر بەناوبانگیش بیت، ئەگەر کار لەسەر کتێبەکەت نەکەیت وەک پێویست ڕەنگە نەفرۆشرێ،

دوای فرۆشتنی کتێب، پێویستە بە دواچون بکەی لەسەر کاردانەوەکان وەک چۆن لە ئەزموونی پەرتوکەکەم، هەڵسام بە دابەشکردنی کۆمەڵێک دیاری بۆ ئەوەی کتێبەکەم بە سەرنجی خەڵکەوە دەولەمەند بکەم، هەڵدەستام بە چاودێریکردنی پەرتوکەکەم کە چیان دەربارەی دەنووسی کۆمێنتیان چیە، دواتر هەڵدەستام بە بڵاوکردنەوەی هەموو کۆمێنتەکان ئەرێنی با یاخود نا، تەنانەت ڕەخنەکانیشم بڵاودەکردەوە، چونکە حەزم دەکرد هەموو شتێک دەربارەی کتێبەکەم بڵاوکردبایەوە، هەندێک جاریش ڕەخنەی دروستکەر هەیە کە سوودی بۆت هەیە.

شـەرم مەکە لە ڕەخنەگـرتن، ئەگەر ڕەخنەگرتنێـک مانـای هەبێـت و سـوودی هەبێـت، ئەوەیە کە ئـێمە داوای دەکەیـن، ڕەنگە توشی ڕەخنەگرتن و هێرشێکی نا مەقول بیت، لە کتێبی پردێک لە ڕووناکی توشی ڕەخنەگرتن و هێـرش بـووم کە زۆر ڕەخنەکانی ئەو کتێـبە بـڵاودەکەمەوە لە تـۆرە کۆمەڵاتییەکان، بـۆچی ڕێـگە نـادەم کتێـبەکەم خـۆی بەبـازار بکـرێ و خـۆی بفرۆشێت، بە دوو جۆر وڵامم دەدانەوە:

١_ ئاڕاستە کردنی پرسیار بۆ ڕەخنەگر:- ئەگەر کتێبەکەم بە دیارنەخسـتبا ئایـا دەتزانـی؟ بیگومـان نەیـدەزانی، کەواتە بـۆچی لۆمەم دەکەن، مـن ڕێکلامـم بـۆ کتێبەکەم نەکردوە لە هیچ گۆڤارێک، چۆن دەربارەی کتێبەکەمت زانـی کە تەنها لە تۆرێ کۆمەلایەتی تویتەر بڵاومکردەوە.

٢_ -کاتێـک کۆمپانیایەک ڕێکـلام بـۆ بەرهەمەکانی دەکات هـیچ کەس ڕەخـنەی لێناگرێـت، ئەگەر خـواردن بـۆ نـاو زگ بێـت، بەڵام خـواردنی عەقـل هەمیشـە ڕەخـنەی لێـدەگیرێت کاتێک ڕێکلامی بۆ دەکریت.
ڕەنگە وڵامدانەوەکەم توند ورەق بێت، بەڵام ئەم هەستیاریەی بۆچیە کە نووسەر کتێبێک دەنووسێ، کاتێکی زۆر دەخایەنێ تا کتێبێـک دەنووسـی و ئامـادەی دەکەیـت، تەنسـیق دەکەیـت و بەدواچـونەوەی بـۆ دەکەیـت، لە ڕووی زمـانەوانی لە ڕووی نووسین، لە ڕووی دیـزان و چاپکردنی هەتـا دیـت ڕەنـگە دوو

ساڵ بخایەنێ، تۆی ڕەخنەگر مافی ئەوەت هەیە بیخوێنیەوە و نەیخوێنیەوە.

•ستیف جۆبز کاتێک هەڵسا بە بەرهەمهێنانی ئامێرە زیرەکەکان (iPhone _ipad _ipod) خۆی هەڵنەستا لە بەرامبەر خەڵک ڕێکلامی بۆ بکات ئامیری زیرەکن وەک کتێب، ئەگەر بەهای ئەو ئامێرانە زۆر کەم بێت بەڵام ناوەڕۆکەکەی زۆر بەرزە ئەمەش نرخی بەرزمان بۆ ڕووندەکاتەوە، ئەوەی دەمەوێت بڵێم، کەسانێک لە بەردەمت هەن ئەیانەوێ تێکت بشکێنن، وە بەهای کارەکەت بە کەم دادەنێن، گرینگی پێمەدە و لەدەست تێبینیەکانی پەرتوکەکەت ڕامەکە، هەڵسە بە بازار خستینی پەرتوکەکەت لە ڕێگای پێشکەش کردنی کۆپیەک بۆ بیرمەندەکان و کەسە زیرەکەکان، وە لێگەرێ خەڵکیش تیروانین بۆ کتێبەکەت بدەن، ئەگەر پەرتوکەکەت نایاب بوو سوپاسی خودا بکە، بەڵام ئەگەر نایاب نەبوو و تێبینی و ڕەخنە زۆری لەسەر بوو ئەوە بە دڵنیایەوە کتێبی دواترت نایاب دەبێت لە ڕێگای ئەو ئەزموونانەی بە دەستی دێینی لە کتێبی یەکەم، دوو دڵ مەبە.

 

١. -پێویست ناکات وایدابنێیت ئەوەی لێرە نووسراوە شتێکە پێویستی بە جێبەجێکردن بێت، بەڵکو کۆششێکی تاکەکەسییە، لە ڕاستیدا ئەوەم کرد. ئەکرێت ئەوەی وتم قازانجی هەبێت، ئەمەش بە ڕەهایی ناکریت بڵێین تاکە شێوازە.

٢. ڕەنگە زۆرێک لە قۆناغەکان تێپەڕێنێت. وە بەیەکیان ببەستیەوە، ڕەنگە هەمان ئەنجامی هەبێت یان باشتر، با چیرۆکێکی خۆشتان بۆ بگێرمەوە، کە لە زانکۆ بووم بەسەرم داهات.

بریارمان دا لەگەڵ هاورێیان بچینە کەنار دەریای نیوەی مانگ لە ناوچە شەرقیە، نزیکەێ ١٥ کەس بوین، بریارمان دا هەر یەکێک بە کارێک هەڵستێ و ڕۆڵی خۆێ لەم کارە ببیێ، کۆتا کەسبووم کە بریارمدا خوانی نیوەرۆ ئامادە بکەم، داوایان لێکردم خواردنی(کەبسە) حازر بکەم کەبسە ئەو خواردنەیە

که بە مریشک ئامادە دەکرێکت خواردنی سەرەکی خەڵکی سعودیایە، بە نسبەت خۆمەوە ئامدەم هەر کارێک بکەم تەنها ئامادەکردنی خواردن نەبێت، هانام بۆ خوشکم برد کە کەبسە چۆن ئامادە دەکرێت، هەموو هەنگاوەکانم لەسەر پەرێک نووسی، کە کاتی ئامادەکردنی خواردنەکە هات بەرێ کەوتم بۆ ناو خیوەتەکە بۆ ئەوەی ئامادەی بکەم، وە کەسێکی شارەزاو لێهاتوو لەگەڵم هات، پێی وتم کە یارمەتیم دەدا لە دروست کردن، زۆر لێهاتوو و شارەزا دیاربوو بۆ دروستکردنی خواردنەکە، چونکە زۆر بە خێرا کارەکانی ئەنجام ئەدا، وەک بڵێی هەنگاوەکانی منی کەمدەکردوە و پێم وت نەختێک بوەستە، ئەم خواردنە هەنگاوی زۆری هەنە کە دەبێت وەک خۆی ئامادە بکرێت،

پێ وتم لە کوێن ئەو هەنگاوانە؟ منیش پەرەکەم دەرهێنا، وە لەدەستی ڕاکێشام خستیە ناو ئاگرەکە، پی وتم لاچۆ، بەڵام بە لێزانی و شارەزایی تەواوی هەنگاوەکانی بە یەک بەستەوە، وە هەمان ئەنجامی نایابی لێ دەرچوو، بۆیە ئەم دوانزە خاڵەی لە پێشتر باسمان کرد دەتواندرێ بەیەک بیبەستیەوە و دەکرێت هەندێکی لێ وەرگریت.

٣- پێشکەشکردن دەکرێت پەیامێک بنێرێت لە ڕووی مانەوە بە هێزبێت لە ڕێگای هەڵبژاردنی وشەکان کە کاریگەری دروست ئەکەن، دورکەوە لەو شێوازە تەقلیدییە، چونکە پێشکەشکردن بە دەربڕینی جوان، کاریگەری زۆر دروست

ئەکـــات، لە ئەزمـــوونی کتێبـــی پردێـــک لە ڕوونـــاکی دوستەواژیەکم بەکارهینا و بەم جۆرە ئارستەم کرد (بۆ ئەو کەسانەی بە ڕوومدا پێکەنین لە کاتی غوربەتیدا، کە منیش ناناسـیت، نە زمـانم ئەزانـی و نە نیشـتمانم، ئەم کتێـبەت پێشکەش دەکەم کە وا دەیخوێنیەوە)

بـێ شـک و گومـان ئەم دەسـتەواژەیە شـێوازی تەقلیـدی تێدەپەڕێنێت.

٤. -بەکارهێنانی ئامرازی پشتگیری، یەکێکە لەو فاکتەرانەی کە پشتگیرت دەبێت و شەکانی ناو کتێبیش بە هێز دەکات و کاریگەری دەبێت، لە ئەزموونی کتێبی پردیک لە ڕووناکی ئەمانەم بەکارهێنا:

١. -ناونیشانی سەرنج ڕاکێش.
٢.- وتەی ناودارەکان کە پڕ مانا بوون، پشتگیری بیروکەی کتێبەکە دەکات وە لە پێشەکی هەر ناونیشانێک دەمنووسی.
٣. وێـنەی کاریکـاتێر لە پێشـەکی هەر ناونیشـانێک، کە بیرۆکەکە ڕوونتر دەکات!.

ئەم سـێ فـاکتەرانە پشـتگیرن وە پـاڵنەرە بـۆ ئەوەی ئاسـتی کتێبەکەت بخاتە ڕوو، سەرنج ڕاکێشی دەکات، وە پێشنیاری زیاترمـان هەیە کە بە هەمـان ڕۆڵ هەڵدەسـتێ و شـتی جـوان دینێتە دی بۆ بەرژەوەندی کتێبەکە وە بۆ بڵاوکردنەوەی.

هەر کەسێک کە بیەوێت کتێبێک بنووسیت با بنووسیت، وە ئەوەی نایەوێت بنووسی پێشنیار دەکەم بنووسیت، مەگەر تەنها لەبەر هۆکاری مەنتقی بێت نەنووسێت، نووسین شێوازێکی (ڕاقیە بۆ بڵاوکردنەوەی بیرۆکەکان، بە شوازێکی یەکسان وە لەسەر خۆ).

هەرجارێک کتێبێکی جوان و بەسوودم خۆێندبێتەوەو کاریگەری لەسەرم دروست کردبیت، سوپاسی خودام کردوە کە کار ئاسانی بۆ نووسەر کردوە و هەلی پێبەخشیووە تا بلاوی بکاتەوە، لە هەمان کاتدا پەشیمان دەبمەوە لەسەر کۆمەڵێک کتێب کە نەنووسراوە لەبەر هەر هۆکارێک بێت، لە بەرامبەردا دڵم ژان دەکات و بەزەیم بەو کتێبانە دێتەوە کە پشتگیری بیرۆکەی خراپ دەدات، یاخود ئەو کتێبانەی کە هیچ بە هایەکیان نییە.

بەو جۆرە کتێب دەنووسرێت بە ڕێگایەکی ئاسان کە شیاوی جێبەجێکردنە چاوەڕێی چیت؟؟!!..

خوێنەری هێژا ئەوەی لە بەر دەستت دایە کتێبێکە لە قەبارە بچووك و لە ناوەڕۆکدا ڕەنگە سادەبێت، بەڵام بۆ ئەوانەی گەرەکیانە بنووسن یاخوود پێشتر نووسیویانەو دەیانەوێت باشتر بنووسن یارمەتیدەرێکی باشە.

ئەم کتێبە خنجیلانەیە ١٣ بەش لەخۆ دەگرێت، لە سەرەتای دروست بوونی بیرۆکەی نووسین لە لات دەست پێدەکات، تا دەگات بە نووسین و چاپکردن و خستنە بازاڕی کتێبەکەتەوە، کۆمەڵێك ڕێگات نیشان دەدات، پێشتر خۆت پەیت پێنەبردوون، سادەن ئەمما زۆر پڕسوودن بۆ کەسێك کە بە دروستی جێبەجێیان بکات.

چۆن کتێبێك بنووسم!؟ ئەگەر وەك ئەوەی نووسراوە هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵی بڕۆیت، بە دڵنیاییەوە تۆ کە بیرۆکەی نووسینی کتێبێکت هەیە، لە دوای خوێندنەوەی ئەمەی بەر دەستت هیچ دوو دڵیت نامێنێت و دەست دەکەیت بە نووسینی کتێبە دڵخوازەکەی ناو خۆت.

نووسین بەرپرسیارێتییە تۆ کە قەرارت داوە بنووسیت هەوڵبدە بە شێوازێکی دروست و شارەزایانە بنووسیت. بەو هیوایەی ئەم کتێبە دەرچەیەکی باشبێت بۆ هەموو ئەوانەی ویستی بوون بە نووسەریان هەیە.

لە بڵاوکراوەکانی کتێبفرۆشی عەنکەبوت - زنجیرە | ٥٨